جیرەی بابەتە فیکرییەکان ٩

پەیامەکانی گەنجان
٣٥

# ئایا قورئان داناوی موحەممەدە؟




موحەممەد مەلا صالح شارەزووری

پەیامەكانی ڕێنوێن بۆ گەنجان 

# ئایا قورئان دانراوی موحەممەدە ؟

ئامادەكردن و پێشكەشكردنی

مامۆستا موحەممەد مەلا صاڵح شارەزووری

زنجیره پەیامەكانی گۆڤاری ڕێنوێن ژمارە ( ٣٥ )


📖 ناوی كتێب: ئایا قورئان دانراوی موحەممەدە ؟

✍ نوسینی: مامۆستا موحەممەد مەلا صالح شارەزووری

* ناوی زنجیرە: زنجیرەی بابەتە فیكرییەكان

* ژمارەی زنجیرە: ٩

* تیراژ : ١٠٠٠ دانە

* نۆبەی چاپ: دووەم

* ساڵی چاپ: ٢٠١٥

* ژمارەی لاپەڕە : ٤٤ لاپەڕە

* دیزاین : ڕێنوێن

* پێداچونەوەی: كۆچەر محمد مەلا صالح

* چاپ : چاپخانەی ڕێ نوێ

* سەرپەرشتیكار : سەركۆ كریم احمد

* نرخ : تەنها (١٥٠٠) دینار

* ئیمەیل: renwen٢٠٠٩@yahoo.com

* ماڵپەڕ: www.aubyc.com

## پێشه‌كی :

ئه‌مه‌وێت سه‌رنجێك بۆ ئه‌و خوێنده‌وارانه‌ی كه ئه‌گه‌ڕێن به شوێن ڕاستی و یاسای هه‌تاهه‌تایی قورئاندا ڕوون بكه‌مه‌وه.. ئه‌ویش مژده‌ی هاتنی مامۆستای نوێخواز له ڕێبازی ئاییندا له ده‌ربڕینــی هه‌ســتی ئایینیــداو كێشــه‌ری ئــایین بــه تــه‌رازوی زانیارییــه‌كانی ســه‌ده‌ی بیســت و بــه‌ره‌نگاری له‌گــه‌ڵ قوتابییــه دواكه‌وته‌كانی بیری فه‌لسه‌فه‌ی بیّ ئامانج....

(موحه‌ممــه‌د مــه‌لا صــاڵح شــاره‌زووری)یه، واتــه خــاوه‌نی ئــه‌م نامیلكــه بچــكۆله‌یه‌ی كــه تــوانی بــه زمــانی چــه‌رخه‌كه‌مان بیچه‌ســپێنیّ كــه قورئــان نێــرراوی خــاوه‌نی ئــه‌م بونه‌وه‌ره‌یــه بــۆ موحه‌ممــه‌د ﷺ و په‌یوه‌ندی به كه‌سایه‌تی موحه‌ممــه‌ده‌وه نییــه، ئه‌ویش به شێوه‌ی (محاضر)ه‌یه‌ك له شــه‌وی به‌فه‌ڕ (ليلة القدر)ی (١٣٩٥)ی كۆچیدا، به ئاماده‌یی كۆمه‌ڵێكی ڕۆشنبیرو لاو له شاره بچكۆله‌ماندا فه‌رمووی:

هه‌رچــه‌نده میلله‌ته‌كــه‌مان نه‌گه‌یشــتۆته ئــه‌و ڕاده‌یــه‌ی كــه لێكۆڵینــه‌وه‌ی ئــایین تێكــه‌ڵ بــه لێكۆڵینــه‌وه‌ی زانســت و فه‌لســه‌فه بكرێت بۆی...

بــه‌ڵام لێــره‌دا مامۆســتا (شــاره‌زووری) هه‌ســتاوه بــه‌و ئه‌ركــه گرنگــه‌و شــانی داوه‌تــه بــه‌رو هــه‌نگاوی نــاوه بــۆ ئــه‌م مه‌به‌ســته،

ئێمــەش بــە هیــوای ســەرکەوتنین بــۆ م.شــارەزووری، زۆر شـادومانین کـە بۆمـان دەرکـەوێت بـە هـۆی زانسـتەکانی کیمیـاو فیزیـاو ماتماتیکـەوە بیسـەلمێنێ کـە ئایینەکـەمانو یاساکەمان (یاسـای قورئـانی پـیرۆز) یاسـایەکی هەمیشـەییو دەسـت لـێ نـەدراوە، بەتایبـەتی لـە کاتێکـدا کـە مامۆسـتا (رشـاد خلیفـة) لـە بارەی ژمێرەری ئەلکترۆنییەوە ئەدوێتو ژمارەی (١٩)ەی (بسـم الله) ئەکاتـە هاوسـەنگ بـۆ کێشـانی هـەموو سـورەتەکانی قورئانی پیرۆز.

تائێسـتا وامـانزانیوە هەرکەسـە بـە ئایینـەوە خـەریك بێـت پێویسـتە گـوێ نـەگرێت لـە گۆڕانکارییـەکانی زانسـتو پلـەی پێشەوەچـونی قۆناغــەکانی ژیــان، وە هەرکەســەش بــە زانستەکانەوە خەریك بێت دوورە لـە قورئانـەوە، وامانـدەزانی کـە ڕۆشـنبیر ئەوەیـە پـێش هـەموو شـتێك واز لـە ئـایینو هـەموو نـەریتێکی نەتەوایـەتی خـۆی وازلێهێنابێـت، بـەڵام وا بۆمـان دەرکەوت کە ئایینی ئیسلام. بە پێچەوانەی ئایینەکانی ترەوە. شان بە شان، بەڵکو لە پێش زانستەکانەوە دەڕواتو ئەوەی کە ئێمەی سەدەی بیست ئێستا دەیخوێنین ئەو پێش (١٤٠٠) ساڵ دەستی بۆ ڕاکێشاوە.

داخوازیمان لە ڕۆشنبیرەکانمان ئەوەیە کە قوڵتر لەو ئایینـەی لـە باو باپیریانـەوە بۆیـان بـەجێ مـاوە لـە ئیسـلام بکۆڵنـەوە هـەتا

بۆیان دەربکەوێت کە ئیسلام تەنها بریتیی نییە تەنها لە نوێژو ڕۆژویەك، بەڵکو ئیسلام ڕێبازێکی ژیانەو مرۆڤایەتی بەبێ ئەم ڕێبازە تامی بەختیاری ناچێژێت، هەروەها داخوازیم لە هەندێ لە زانایانی ئایینی ئەوەیە کە نەبنە کۆسپ لە ڕێگەی ئەو مامۆستایانەی کە ئەیانەوێت زانستو پێشکەوتنی ماددی بکەنە چەکێك بۆ پارێزگاری لە گیانی خاوێنی ئیسلامو ئیسلام نەبەستن بە چەند کتێبێکی دیاری کراوەوە کە ئەو کتێبانەش چەند مرۆڤێکی وەك ئێمەو ژیاوی چەند سەدە لەمەوبەر دایناییێتو بەکەڵکی ئەمڕۆی ئێمەش نەیەتو لاوەکانیشمان وابزانن کە ئیسلام بە کەڵك نایەت.

هیوادارم خوا یارمەتیمان بدات بۆ دۆزینەوەی ڕێگای ڕاستی ژیان.

محێدین ڕەشید گەلاڵی

مامۆستای ماتماتیك و فیزیك لە قوتابخانەی ناوەندی سەیدصادق

**بۆچوون :**

دانیشــتوانی بــەڕێز بــەخێرهاتنی گــەرم‌و گوڕتــان دەکــەم‌و هیوادارم کە بتوانین گوێی دڵمان بکەینەوەو هەوڵ بدەین وتەی چاك ببستین.

بەڕێزان.. ئەمشەو کە شەوی بەفەڕ (لیلة القدر)ە[1]، ڕونە کە لەم شەوەدا یەکەم وتەی قورئانەکەمان هاتووەتە خوارەوە بۆ پێغەمبەر ﷺ و بەم بۆنەیەوە لە هەموو جیهانی ئیسلامی کۆڕی خواپەرستی ئەکەن و لەگەڵیٚ شوێن لە بارەی ئەم قورئانەوە ئەدوێن، خۆشحاڵم بۆ یەکەمجار لەم کۆڕەدا هاوبەشیم لەگەڵدا بکەن‌و لەبارەی ئەم قورئانەوە بدوێن، بەڵام ئەوەی کە گرنگ بێت بە لامانەوەو جێگای لێکۆڵینەوەی زیاتر بێت تەنها ئەوەیە کە (ئایا قورئان دانراوە موحەممەدە ؟ ، یان نێرراوی خوایە بۆ موحەممەد)، جا ئەگەر توانیمان بیسەلمێنین کە نێنراوی خوایە، ئەوە بە تیرێك سیٚ نیشانە ئەشکێنین:

یەکەم: دەیسەلمێنین کە خوایەك هەیەو بەرنامەیەکی بۆ مرۆۆ ناردوە.

دووەم: موحەممەد . دیارییە . نێرراوی ئەو خوایەیە، ئەگینا چۆن بەرنامەیەکی ژیانی بۆ ئەنێریٚ.

---

[1] سالّی ١٣٩٥ی کۆچی‌و لە مزگەوتی گەورەی سەیدصادق .

سـێهەم: قورئـان داخـوازى خوايـە لـە بەنـدەكانى، خـۆ ئەگـەر نـــەشمانتوانى بيســـەلمێنين واشـــيرازەى ئيســـلام لاى ئێمـــە هەڵوەشاوە ئەبێت.

لێـرەدا لــە هــەموو شــت ســەيرتر ئەوەيـە زۆربــەى ئەوانــەى باوەڕيان بە قورئان نييە كە نێرراوى خوايە، هيچ لێى ناكۆڵنەوەو وادەزانن پێويستى بە خۆماندو كردن نييەو چەسپاندويانە كە قورئـان دانـراوى موحەممـەدە، ئـيتر لێكۆڵينـەوە پێويسـت نييـە، تەنانەت ناوبردنى بەڵگەيش بققەيە، ئەم پاگەندەيە جار بۆ جار تـازە ئەكرێتـەوە لـە هـەموو كـاتو ڕۆژێكـدا، بـەلاَم چـونكە ئـەم بۆچونە بە بەڵگەوە ناكەوێتـە بەردەم لێكۆڵينـەوە، لەگـەڵ تـەرمى خاوەن ڕاكەدا ئەخرێتە گۆڕەوە.

ئێمـە بـەو شـێوەيە نـاودێين، بـەڵكو بەڵگـەى ڕاسـت بنچـينەى لێكۆڵينەوەكەمانـەو تـەنيا گـوێ بـۆ وتـەى زانايـانى و ژێـرى ئـەگرينو دواجـار بڕيـار دەدەيـن، پێشـەكى بـابزانين ئايـا پلـەى خوێندەوارى موحەممەد ﷺ تا چ ڕادەيەك بووە؟

چونكە وەكو لەمەودوا باسـى ئەكـەين قورئان لـە پلەيـەكى زۆر بـەرزى خوێندەواريدايـەو ئـەم هـەموو پێشـكەوتنەى كـە زانسـتى ئێستا پێى گەيشتووە نەگەيشتۆتە پلەى بەرزى قورئـان تەنانـەت بە ئامێرى ئەليكترۆنيش.

## نەخوێندەواری موحەممەد :

ئاشــكرایە دانــانی بەرنامەیــەكی ژیــانیی وەك قورئــان، بــە مرۆڤێكی ئاسایی ناكرێت، بگرە بە بە كەڵكترین پرۆفیسۆریش ناكرێـت، جـا ئەگـەر ئێمـە بڵـێین (موحەممـەدﷺ) نەخوێنـدەوارە، ئیتر جێگای گومان نابێت كە قورئان بالاّدەست ترە لە موحەممەد و لـە هـەموو ئادەمیزادێكی سـەدەی موحەممـەد، چـونكە ژیریـی وەریناگرێت كە كارێك بە پرۆفیسۆرێكی ئەمڕۆی ئێمـە ناكرێـت، ئـیتر چـۆن نەخوێنـدەوارێكی (١٤٠٠) سـاڵ لەمەوبـەر و ژیـاوی نەزانترین گەلی ئەوكاتە دەتوانێت بیكات ؟

( ٱلَّذِينَ يَتَّبِعُونَ ٱلرَّسُولَ ٱلنَّبِيَّ ٱلۡأُمِّيَّ ) (الأعراف: ١٥٧).

ئــەو موســوڵمانانە ئەوانــەن كــە شــوێنی ئــەو پێغەمبــەرە نەخوێندەوارە ئەكەون و لەسەر ڕێبازە ڕاستەكەی ئەو ئەڕۆن.

لە شوێنێكی تردا قورئان دەفەرموێ بە موحەممەدﷺ:

( وَمَا كُنتَ تَتۡلُواْ مِن قَبۡلِهِۦ مِن كِتَٰبٍ ) (العنكبوت: ٤٨)

واتــە: موحەممــەد تــۆ پــێش هــاتنی قورئــان هــیچ پــەڕاوێكت نەخوێندوە.

ئەمانــەو چــەندین ئایــەتی تــر بــە خــەڵكی ئەگەیــەنێت كــە (موحەممــەدﷺ) نەخوێنــدەوارە، لێــرەدا پــەنا بــە خــوا بــابڵێین باوەڕمــان بــەوە نــەبێت كــە قورئــان ئــەڵێت موحەممــەد تــۆ

نەخوێندەواریت و بڵێین خوێندەوار بووە، ئایا چۆن ناحەزەکانی موحەممـــەدﷺ، موحەممـــەدیان بـــە درۆ نەئەخســـتەوە و چـــۆن موحەممـەد ئـەیتوانی لـەناو ئـەو هـەموو ناحەزانەیـدا بڵێـت مـن نەخوێندەوارم؟ چۆن بە درۆیان نەدەخستەوە؟ چۆن نـەیان دەوت تۆ لە فلانە ڕۆژ لای فیسارە خوێندەوار خەریکی خوێندن بویت؟ ئاشکرایە نەبووەو زۆر ڕوونە موحەممەد نەخوێندەوار بووە.

کاتێـك بـۆ یەکـەمجار سـروش (وەحـی) بـۆ هـات، زۆر ترسـاو نەخۆش کەوت و بە دەم لەرزەوە هاتەوە بۆ ماڵەوەو نەیدەزانی کە ئـەبێت بـە پێغەمبـەرو نەیـدەزانی چ بـارێکی گـران بەسـەر شـانیدا دراوەو چـــی چـــاوەڕێی دەکـــات ؟ هـــەتا خێزانـــە دڵســـۆزەکەی (خەدیجە) دڵخۆشی دایەوەو پێـی فەرموو: "مەترسـە تـۆ هـەرگیز لە ژیانتدا زیان نابینی، چونکە چاکترین و دڵنـەرمترین مرۆڤیـت و یارمەتی لیَ قەوماو ئەدەیت و سەر لە کەس و کارت ئەدەیت".

ئەگـەر موحەممـەد خـۆی نوسـەرو دانـەری قورئـان بێـت بۆچـی ئەبێت نەخۆش بکەوێت و پێویستی بە دڵنەوایی هەبێت ؟

## مەبەستی چی بوو ؟

با ژێری پـی شـێل بکـەین و بڵـێین، ئەگـەر موحـەممـەدﷺ خـۆی نوسـەرو دانـەری قورئـان بـوبێ، ئـەبێت مەبەسـتی چـی بوبێـت کـە فەرمویەتی: من ئەم قورئانەم لە لایەن خـواوە بـۆ دێـت؟ مەبەسـتی کۆکردنـەوەی دارایـی و سـامان بـوو؟ ئـەی مەبەسـتی دابینکردنـی ئافرەت بوو؟ ئەی مەبەسـتی سـەرۆکایەتیی و پاشـایەتیی بـوو؟ با بـزانین کاتێـك موحەممــەد بانگــەوازی کــرد لــەناو قورەیشــدا فـەرمووی: "مـن نێـرراوی خـوام بـۆ لای ئێـوە هـەتا خـوا بـە تـاك و تــەنها بپەرســتن و بــت نەپەرســتن"، ئایــا قورەیشــییەکان چــۆن پێشوازیان لێ کرد؟ وتیان: فەرت هێنا، بەخوا شتێکی باشـت بـۆ هێنــاوین؟ دیارییــە نــا، بــەڵکو بــە ناپیــاوترین شــێوە لەگــەڵی هەڵسان و بە ناپەسەندترین شێوەو کردەوە لەگەڵی جوڵانەوە.

ئایـا لـە کـاتی نوێژکردنیـدا لـە کەعبـە، پیسـایی نـاو ورگـی ئاژەڵیــان نەخســتە ســەر ســەری ؟ ئایــا بــە هــەزاران فڕوفێڵیــان بەکارنـەهێنا بـۆ کوشـتنی ؟ ئایـا بـۆ مـاوەی سـێ سـاڵ هـەمویان دەرنەکرانـە دەرەوەی مەککـەو دەنگیـان لـێ دانـەبڕین و لـە شـیوی ئەبوتالیبدا بە گژو گیاو کولەمەرگی نەژیان ؟[٢].

---

[٢] بڕوانە کتێبی ژیانی پێغەمبەری مەزن ﷺ، مامۆستا شێخ عەزیز پارەزانی، ل٢١٢.

لـەم كاتانـەدا كـە زۆر جـار موحەممـەدﷺ لـە برسـاندا بـەردى دەخستە ژێر (تەكبەند) پشتێنەكەيەوە، عەتيەى كوڕى ڕەبيعە بە نێرراوى لە لايەن قوڕەيشييەكانەوە هات بۆ لاى موحەممەدو پێى وت: برازا گيان تۆ دەزانى كە ئێمە خاوەنى چ ڕێزێكين لە ياساى خێڵايەتيداو چۆن پلەيەكى بەرزمان هەيە لـە ڕەگەزايەتيـدا، بـەڵام تۆ شتێكى گرنگت هێناوە بۆ ناومـان، كۆمـەڵت تێكداين، خـەوى شـاديت زڕانـدين، گـوێم لـىٚ بگـرە چـەند پێشـنيارێكت ئەخەمـە بەردەست، بەڵكو يەكێكيان هەڵبژێريت.

موحەممەدﷺ فەرمووى: بڵێ باوكى وەليد، بزانم گـوێم لێتـە، وتـى: "برازاگيـان ئەگـەر بـە هێنـانى ئـەم ئايينـە تازەيـە مەبەستت كۆكردنەوەى ماڵو سامانە، ئەوەندە ماڵت بۆ كۆدەكەينەوە تـا لـە هەموومان دەوڵەمەندتر بيت، ئەگـەر مەبەستيشـت سـەرۆكايەتييە ئەوا دەتكەين بە سەرۆك و گـەورەمان، هـيچ شـتێك بـىٚ پرسـى تـۆ ناكــەين، ئەگــەر زەوىو زارت ئــەوىٚ چــەندت ئــارەزوو هەيــە ئامــادەين بتــدەينىٚ، خــۆ ئەگــەر جنۆكــەو خێــو دەســتى لێوەشـاندويتو پێـت چـار ناكرێـت هەرچـييەكمان هەيـە لــە پێناوتدا دايدەنێين هەتا لاى پزيشك چاكت دەكەينەوە".

موحەممـەد فـەرموى: لـە پێشـنيارەكانت تـەواو بـووى؟ وتــى: بەڵىٚ.

موحەممـەد فـەرموی: دە گـویّم لیّبگـرە: دەسـتی کـرد بـە قورئـان خویّنــدن بەســەریدا لەســەرەتای ســورەتی (الفصـلت)ەوە هــەتا گەیشتە ( فَإِنۡ أَعۡرَضُواْ فَقُلۡ أَنذَرۡتُكُمۡ صَٰعِقَةٗ مِّثۡلَ صَٰعِقَةِ عَادٖ وَثَمُودَ ﴿١٣﴾ )

لیّرەدا عەتیە خۆی پیّ ڕانەگیراو هاواری لیّ بەرزبویەوەو دەستی گرت بە دەمی موحەممـەدداو موحەممەدی بیّدەنگ کـرد، پـاش بیّدەنگ بونی موحەممـەد بـەبیّ ورتـە هەڵساو گەڕایـەوە بـۆ نـاو قورەیشـییەکان، ئـەوانیش هـاتن بـەرەو پیری و وتیـان: هـا چیت کـرد بـاوکی وەلیـد؟ وتـی: چـیم کـرد؟ بـە خـوا شـتیّکی بـۆ خویّندمـەوە نەهەڵبەسـتە هەڵبەسـت بـیّو نەسـیحرو جـادووە، نـە هـی فاڵچـییەکانە، تکاتـان لـیّ دەکـەم کۆمـەڵی قـوڕەیش واز لـەم پیاوە بهیّنن چی دەکات با بیکات.

قوڕەیشـییەکان دوا پـلاری ناچـارییان ئـەوە بـوو وتیـان: ئـەوە جادوی لـیّ کردویت باوکی وەلیـد وتـی: مـن پیّشـنیارم وایـە جا خۆتان چی لیّ ئەکەن بیکەن.

ئـەم وتویّـژ ( ڕیّکـەوتن = مفاوضـات )ە جـار بـۆ جـار دوپـات ئـەبوەوە، چـونکە ئـەوان (وەك زۆربـەی زاناکـانی خۆمـان) وایـان دەزانــی موحەممــەد مەبەســتی کۆکردنــەوەی دارایــیو ســامانو پایـەی نـاو خەڵکییـە، جـاریّکی تـر قوڕەیشـییەکان چـوونە لای ئەبوتالیبی مامیو وتیان: برازاکەت ئابڕوی بۆ نەهیّشتوینو پلار

ئەگرێتـە خواکانمـان‌و ئـاییـنێکی تـازەی هێنـاوە، ئەگـەر واز لـەم بیروبـاوەڕەی بهێنـێ داوای چـی ئـەکات بـۆی ئەکـەین، گـەورەیی ئەوێ، ژنی ئـەوێ، دارایـی ئـەوێ، چـی بوێ بۆی دەکـەین، تـۆ لـە جیاتی ئێمە ئەمەی پێ ڕابگەیەنە، خۆ ئەگەر هەر واز ناهێنێ‌و بە تـۆیش (واتـە ئـەبوتالیب) چارەسـەر ناکرێـت ئـیتر وازی لـێ بێنـە ئێمـە چارەی ئەکـەین، کاتـێ مـامی ڕۆیشـت بـۆ لای‌و پێشـنیاری قوڕەیشـییەکانی پـێ ڕاگەیانـد، موحەممـەد بـە دڵێکـی پـڕ لـە بـاوەڕەوە بەرامبـەر بـە بیروباوەڕەکـەی وتـی: ( والله لـو وضـع الشـمس في يمـيني والقمـر في يسـاري علـى أن أتـرك هـذا الأمـر مـا تركته حتى يظهره الله أم أهلك دونه ).

واتـە: سـوێند بێـت بـە خـوا ئەگـەر هـەتاو بخەنـە لای ڕاسـتم‌و مـانگیش بخەنـە لای چەپم . واتـە ئەوەنـدەم دەسـەڵات بدەنـێ . بە مەرجی وازهێنان لەم (ئایین) کارە، وازنـاهێنم‌و سـورم لـە سـەری هەتا یان خوا سەرم دەخات ، یان لەپێناویدا لەناو دەچم.

بەڵێ لەم کاتی تەنگانەو ئەشکەنجەدا ئەمە وەڵامی ئەو بوو بۆ وەرگرتنی سامان‌و دەسەڵات.

دیاریشـە کـە موحەممـەد لـە پـێش بانگەوازەکەیـدا دەوڵەمەنـد بووە بە هۆی سامانی ژنە دەوڵەمەندە دڵسۆزەکەی (خەدیجە)وە، بـەڵام هـەمووی لـە ڕێگـای ئیسـلامدا بـەختکردو لـە ئەنجامیشـدا پـاش تەمـەنێکی زۆری پـڕ لـە تێکۆشـان و خـەبات‌و ئەشـکەنجەو

هـەزاران جۆرە ئازار، بە هـەژاری سەری نایـەوەو تەنانـەت چـەند جار لە سەر هەژاری ئاژاوە دەکەوتە نێو خێزانەکانییەوە[٣].

بەو جۆرە بۆمان دەرکەوت موحەممەد مەبەستی کۆکردنـەوەی سامان و دەسەلات نەبوو، زۆریش ڕوونە کە موحەممەد مەبەستی خۆهەڵکێشان و ناو ناوبانگ نـەبووە، نموونـە زۆرە لـەم بارەیـەوە، بـەلام تاقـە نموونەیـەکیش لـەم بارەیـەوە ئەهێنمـەوەو کـوردیش ئەڵێ: مشتێك نموونەی خەروارێکە.

کاتێ کـە ئیبراهیمـی کـوڕی مردو بردیـان بۆ گۆڕسـتان . تـەنها ئـەو کوڕەشـی هـەبوو . لـە کـاتی شـاردنەوەیدا، هـەتاو گـیرا، لەمکاتـەدا لـە نـاو موسـڵمانە سـادەکاندا بـوو بـە قـاو کـە هـەتاو هاوبەشـی پێغەمبـەری ﷺ کـردوە لـە ماتـەمی کوڕەکەیـداو لەبـەر دڵی ئەم هەتاو گیراوە.

خـــۆ ئەگـــەر موحەممـــەد مەبەســـتی خۆهەڵکێشـــان و خودپەسـەندی بوایـە ئـەم هەلـە چـاکترین شـتە هـەتا بیکـات بـە پڕوپاگەنـدە بـۆ خـۆی، بـەلام موحەممـەد چـووە سـەر دوانگـە (منـبر)ی مزگـەوت و فـەرموی: (هـەتاو و مـانگ دوو نیشـانەی دەستکردنی خوان بۆ مردن و ژیانی کەس ناگیرێن)[٤].

---

٣ بڕوانە پەڕاوی (ژیانی پێغەمبەری مەزن)، مامۆستا پارەزانی، ل٤٥٨ .

٤ هەمان سەرچاوەی پێشوو. ل٤٨٠ .

بەم ڕۆشنکردنەوە سەرپێیە بۆمان دەرکەوت کە موحەممەد مەبەستی هیچ شتێك نەبووە تەنیا خواپەرستی نەبێ و ڕزگارکردنی مرۆڤایەتی لە ئەفسانەو جادوگەری بێ سڵکردنەوە لە ئەشکەنجەو مردن.

## جیاوازی حەدیث و قورئان :[5]

ئەگــەر بــە چــاوێکی ڕۆشــنبیری و ئەدیبییــەوە ســەیری ئایەتــەکانی قورئــان بکــەین لــە لایەکــەوە، ســەیرێکی تــری فەرمودەکانی موحەممەد بکەین لە لایەکی ترەوە، زۆر بە ئاشکرا جیاوازییان دەرئەکەوێت، چونکە لەگەڵ ئەوەدا کە فەرمودەکانی موحەممــەد زۆر قــوڵ و پڕمانــاو لــە داڕشــتنێکی زۆر بــە پێــزدا ئەبینرێن، بەڵام بە هیچ جۆرێك ناگەنە پلەو پایەی قورئان چ لە ڕوی ڕەوانبێژی و چ لە ڕوی مانا فراوانی و چ لە هەموو ڕویەکی تری زانیاری و ئەدەبییەوە، هەموو ئەدەب دۆستێك دەزانێ کە یــەك ئــەدیب ناتوانێــت دوو جــۆرە نوســراوی هــەبێت و هــەر نوسراوەی خاوەنی سروشتێکی تایبەتی بێت و جیا جیابن لە یەکتری.

بەتایبەتی نوسراوێك کە لە ماوەی (٢٣) ساڵدا تەواو بوبێت و بە پێی کات و شوێن و پێویست دانرابێت وەکو قورئان.

سەرەڕای ئەمانە، لە پشت وتارەکانی موحەممەدەوە هەست دەکــرێ بــە کەســایەتی (شخصــیە)یێکی ئــادەمی کــە زۆرجــار زەبونی و بێ چارەیی ڕوی تێ بکات، بەڵام لە پشت ئایەتەکانی قورئانەوە کەسایەتییەکی بەهێزو بەدەسەڵات و بێباك و ئاگادارو

---

[5] مەبەستمان لە (حدیث) فەرمودەکانی موحەممەده .

دادپــەروەر دەردەکــەوێت کــە بــە هــیچ شــێوەیەك لاوازی بــە خاوەنەکەیـەوە دیـار نییـە، تەنانـەت لـەو شوێنانەشـدا کـە جێـی دڵنەرمییـە، لەمـەوە دەردەکـەوێت کـە قورئـان ئەگـەر فـەرمودەی موحەممەد بوایە لەگەڵ فەرمودەکانی خۆیدا جیاوازی نەدەبوو، چونکە هـەموو نوسـەرێك یـەك شێوەو ڕێبازو ئاهـەنگی هەیـە لـە نوسیندا، هـیچ کـەس ناتوانێت بە دوو شێوە بنوسیٚ بەم جۆرە لەیەك نەچن، کە ئەمە گەورەترین بەڵگەیە لەسـەر ئـەوەی قورئـان سروش (وەحی)ی خوایە نەك فەرمودەی ئادەمی[٦].

[٦] تەفسیری خاڵ، جزمی یەك، ل٧٠.

## ڕەخنەگرتنی قورئان لە موحەممەد :

هـیچ نوسـەرێك نییـە کـە هەڵوێسـتە لارەکـانی خـۆی نەپۆشـیٚ‌و هەوڵی تاشینی بەڵگە نەدات بۆ ڕاستکردنەوەی لارییەکەی، ئایا هـیچ کەسێك هەیـە بـەم توندوتیژییـەی . وەك لەمـەودوا باسـی دەکـەین . ڕەخنـە لـە خـۆی بگرێـت‌و دوایـی بیکـات بـە قورئـان‌و فـەرمان بـدات بـە شـوێنکەوتوەکانی بـە وردی لـە ڕۆژانـەیان بیخوێننەوە؟؟

بۆ نموونە، ڕۆژێك موحەممەد خەریکی باسکردنی ئیسلام بوو بۆ کەڵەپیاوانی قوڕەیش وەك لەبیدی کوڕی موغیرەو ئەبوجەهل‌و گەورەکانی تر، ئا لەمکاتـەدا پیـاوێکی کوێری موسڵمان بەناوی عەبدوڵڵای کوڕی ئوم مەکتوم هات بۆ لای موحەممەدو نەیدەزانی موحەممەد خەریکی چییە، وتی: موحەممەد لەو شتەی خوا بۆی ناردویت فێرم بکە، موحەممەد وەڵامی نەدایـەوە، بـۆ جـارێکی تـر دوبـارەی کـردەوە، دیسـان موحەممـەد هـەر وەڵامـی نەدایـەوە بـۆ جاری سێهەم داخوازییەکەی سیٚ بارە کـردەوە، بەڵام موحەممـەد زۆر پەسـت بـوو ناوچـاوی گـرژ کـردو ڕوی وەرچـەرخاند بـە لای دەوڵەمەنـدەکان‌و سـەرۆکەکانی قوڕەیشـدا و وەڵامـی ئـەو کـوێرە هەژارەی نەدایەوە.

خۆ ئەگەر ڕاست بێت موحەممەد ﷺ نێرراوی خوا بێتو ئەو قورئانــەی لای خــواوە بــۆ بێــت چــۆن ئــەبێ ئــەم هەڵوێســتەی بەسەرەوە بچێت ؟

چونکە لای خوا ئەو کوێرە هەژارە پەسەندترە لەو دەوڵەمەندە سەرکەشانە، بۆیە قورئان زۆر بە توندی ڕەخنەی لە موحەممەد گــرتو فــەرمووی: (عَبَسَ وَتَوَلَّىٰٓ ﴿١﴾ أَن جَآءَهُ ٱلْأَعْمَىٰ ﴿٢﴾ وَمَا يُدْرِيكَ لَعَلَّهُۥ يَزَّكَّىٰٓ ﴿٣﴾ ) سورة عبس

واتــە: موحەممــەد ڕوی گــرژ کــردو ڕوی وەرچــەرخاند لەبەرئــەوەی کــوێرێکی هــەژار هــات بــۆ لای، بــەڵام موحەممــەد تــۆ چــوزانی لەوانەیە ئەم کوێرە هاتبێت بۆ ئەوە خۆی لە ژەنگی دنیاپەرستی پاك بکاتەوە بۆ خواپەرستی.

سەیری ئەم ڕەخنە گەورەیە بکەن، چۆن مرۆڤێك خۆی وا ئەڵێ بــە خــۆیو دوایــی ئــەیکات بــە قورئانێــك بــۆ خوێندنــەوەی هــەتا هــەتایی، ئەمــە تاقــە ڕەخنەیــەك نییــە کــە قورئــان گرتبێتــی لــە موحەممەد، ئەگەر سەیری قورئان بکەین بە دەیان ڕەخنەی لەمە تونــدتر هەیــە کــە قورئــان لــە پــێش چــاوی شــوێنکەوتوەکانی موحەممەد کە موحەممەدی پێ شکاندوەو ڕەخنــەی لــێ گرتــووەو نــاڕەزایی خــۆی دەربڕیــوە بەرامبــەر بــەو کــارەی کــە موحەممــەد کردوویەتی.

نموونەیەکی تر، جووەکان وتیان بە قورەیشییەکان لە بارەی سیّ شتەوە پرسیار لە موحەممەد بکەن، ئەگەر توانی وەڵاممان بداتەوە ئەوە ڕاست ئەکات پێغەمبەرە، خۆ ئەگەر نەیتوانی ئەوە هیچ ، سیّ شتەکەیش:

یەکەم: نهێنی ئەو گیان (روح)ەی زیندەوەران پێی ئەژین ؟

دووهەم: هاوڕێکانی ناو ئەشکەوتەکە (أصحاب الكهف) کیّ بون ؟

سێهەم: (ذوالقرنين) کیّ بووە ؟

پاش هاتنی قورەیشییەکان بۆ لای موحەممەدو کردنی پرسیارەکانیان، موحەممەد سەربەخۆ فەرمووی: بەیانی وەرنەوە وەڵامتان دەدەمەوە، بەتەمای ئەوەبوو کە خوا وەڵامی پرسیارەکانی فێربکات، بەڵام موحەممەد چۆن ئەتوانیّ ماوە بۆ خوا دابنێت و خوا قورئانی بۆ بنێریّ، ئاشکرایە کە موحەممەد ناتوانیّ ماوە لەسەر خوا دیاری بکات، بۆیە خوا دەروی سروشی لیّ داخست و تا ماوەی (١٥) ڕۆژ هەموو ڕۆژێك قورەیشییەکان ئەهاتن بۆ وەڵامی پرسیارەکان و موحەممەد هیچی نەدەزانی و هەموو ڕۆژێك هەر دەیگوت بەیانی وەرنەوە، هەتا دەمی بیّ ئابڕویی قورەیشییەکان بەرەڵڵا بوو دەستیان کرد بە گاڵتەکردن بە موحەممەد، لە پاش گاڵتەو لاقرتییەکی زۆری قورەیش و جووەکان بەرامبەر بە موحەممەد و پاش (١٥) ڕۆژ وەڵامی

پرســيارەكانى بــۆ هــات، بــەڵام چ هاتنێــك لەگــەڵ ڕەخنــەو سەرزەنشــتدا، قورئـان دەفـەرموێ: ﴿ وَلَا تَقُولَنَّ لِشَاْىْءٍ إِنِّي فَاعِلٌ ذَٰلِكَ غَدًا ﴿٢٣﴾ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُۚ وَٱذْكُر رَّبَّكَ إِذَا نَسِيتَ ﴾ (الكهف: ٢٣. ٢٤)

واتە: بۆ هیچ شتێك مەڵێ بەیانی ئەیكەمو پەیمان مەدە، چونكە تۆ ناتوانی كات لە سەر خوا دیاری بكەیت، هەتا خوا ئارەزوی لـێ نەبێت، كەواتـە بۆ هـەموو شـتێك بڵـێ . ئەگـەر خوا ئارەزوی هـەبوو، خـوا لـە یـاد خـۆت مەبـەرەوە، هـەر كاتێك لـە یـادت چوو یادی بكەرەوە.

زۆر ئاشـكرایە ئەگـەر موحەممـەد خـۆی قورئـانی دابنایـە بـەو شـێوەیە خـۆی نـەدەكردە گاڵتەچـی بـێ ئابڕووەكـانی قـوڕەیش‌و جووەكان‌و پەیمانەكەی خۆی لە كاتی خۆیدا بەجێ دەهێنا.

لە دەیان هەڵوێستی تردا قورئان ڕەخنەی لە موحەممەد گرتووە، وەك ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ لِمَ تُحَرِّمُ مَآ أَحَلَّ ٱللَّهُ لَكَۖ تَبْتَغِي مَرْضَاتَ أَزْوَٰجِكَ ﴾ (التحريم: ١).

لەســەر ئـازادكردنی هەنـدێك لـە دیلـەكانی (بـەدر) بـە پـارە دەفـــــــەرموێ: ﴿ مَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَكُونَ لَهُۥٓ أَسْرَىٰ حَتَّىٰ يُثْخِنَ فِي ٱلْأَرْضِۚ تُرِيدُونَ عَرَضَ ٱلدُّنْيَا وَٱللَّهُ يُرِيدُ ٱلْـَٔاخِرَةَ ﴾ (الأنفال: ٦٧)

یان بە موحەممەد دەفەرموێ:

﴿ وَتَخْشَى ٱلنَّاسَ وَٱللَّهُ أَحَقُّ أَن تَخْشَىٰهُ ﴾ (الأحزاب: ٣٧)

یان ئەو ئایەتەی کە دەفەرموێ: (قُلۡ مَا كُنتُ بِدۡعٗا مِّنَ ٱلرُّسُلِ وَمَآ أَدۡرِي مَا يُفۡعَلُ بِي وَلَا بِكُمۡۖ) (الأحقاف: ٩)

واتـە: موحـەممـەد بڵـێ بـە هاوڕێکانـت مـن یـەکـەم پێغەمبـەر نـیم، بـەڵکو منـیش هــەر یـەکێکم وەك موسـاو عیسـاو... هتـد، نـازانم چیمان لێ ئەکرێت و چیمان بەسەردا دێت، چ خۆم و چ ئێوە.

کاتێـك ئـەم ئایەتـە هاتـەخوارەوە بـۆ موحەممــەد قـوڕەیش و جووەکـان کەوتنـە گاڵتـەو لاقرتـی بـە موحـەممـەد و هاوەڵـەکانی و دەیـانگوت چـۆن مـرۆڤ ئەکەوێتـە شـوێن یـەکێك کـە نـەزانێ چـی بەسـەردا دێـت؟ کەسـێك پاشـەڕۆژی خـۆی و شـوێنکەوتوەکانی نەزانێت کەی بۆ ئەوە ئەشێت مرۆڤ خۆی بدات بە دەستییەوەو شوێنی بکەوێت ؟

بتپەرست و جووەکـان دەمـی بـێ نرخـی و کورتبینییـان بـەرەڵڵا بوو کەوتنە گاڵتە کردن پێیان، ئا بـەم جـۆرە بۆمـان دەرکـەوت کـە قورئـان زۆر باڵادەسـت تـرە لـە موحەممـەد، ئـەگینا ئـەم ڕەخنـە گـەورە گەورانـەی لـە خـۆی نـەدەگرت و هـەتا هەتایشـە بمێنێـت، دیسان قورئان بۆ چارەسەرکردنی گیروگرفتـەکانی باوەڕ ئەهاتـە خوارەوە، هیچ هاوبەشییەکی موحەممەدی نەئەکرد لـە خۆشـی و ناخۆشــیدا، لەیــەك ســاڵدا ژنــە دڵســۆزە خۆشەویســتەکەی (خەدیجە) و مامـە پشـتیوانەکەی (ئـەبوتالیب) مـردن و موحەممـەد

ئـەو سـاڵەی ناونـا بـە سـاڵی (ماتـەمی)، کەچـی قورئـان بـەهیچ جۆرێـك باسـی نـەکردو هاوبەشـی موحەممـەدی لـەو ماتەمییـەدا نەکرد.

## هەواڵدان بە پاشەڕۆژ :

هیچ کەس ناتوانێت لە خۆیەوە هەواڵی پاشەڕۆژێکی نزیك یان دوور بدات، بەتایبەتی بۆ پێشەواو سەرۆکێکی وەك موحەممەد، چونکە هەواڵدان لە خۆوە هۆی شکان و بەدرۆکەوتنەوەیە، بەڵام قورئان چەند هەواڵێکی پاشەڕۆژی داوەو لە پاشان وەك ڕۆژی ڕوناك لە دەمی کەلی ڕاستییدا هەڵهاتووەو یەك لە دوای یەك هاتونەتەی دی، وا چەند نمونەیەکی کەم لەو ڕوداوە زۆرانە دەخەینە پێش چاو:

١. کاتێ موحەممەد لە مەککە بوو، فارس و ڕۆمەکان بوو بە شەڕیان، لەبەرئەوەی ڕۆمەکان خواپەرست بون و فارسەکان ئاگرپەرست، موحەممەد نزای سەرکەوتنی بۆ ڕۆمەکان دەکرد، کەچی فارسەکان سەرکەوتن، لەو کاتەدا بتپەرستەکانی مەککە زۆر شادمان بون و موسڵمانەکان ماتەمینی دایگرتن، بەڵام قورئان هەواڵی دا بە موسڵمانەکان کە لە ماوەیەکی کەمدا شەڕ لە نێوان فارس و ڕۆمەکاندا سەرهەڵدەداتەوەو ئەمجارەیان خوا ڕۆم سەردەخات بەسەر فارسدا، وەك ئەفەرموێ: (غُلِبَتِ ٱلرُّومُ ۝٢ فِيٓ أَدۡنَى ٱلۡأَرۡضِ وَهُم مِّنۢ بَعۡدِ غَلَبِهِمۡ سَيَغۡلِبُونَ ۝٣ ) ، سورة الروم

واتە: سەرکەوتن بەسەر ڕۆمدا لە زەوییەکی نزمی لای ئێوەوە، بەڵام لە دوای ئەم تێکشانە، ڕۆم سەردەکەونەوە لە ماوەی چەند

سـاڵێکی کەمـدا، (بضـع) لـە زمـانی عەرەبیـدا بەکارئـەهێنرێت بـۆ ژمـارە لـە (٣ـ٩) کەچـی لـە پـاش (٧) سـاڵ شـەڕ هەڵگیرسـاو ڕۆم سەرکەوت بەسـەر فارسدا، واتـە پـێش تـەواوبونی ماوەکـە بـە دوو سـاڵ پەیمانەکـەی قورئـان دەرکـەوت، ئایـا بـە دی هـاتنی ئـەم پەیمانە ناو دەنێن چی؟

٢. لــە جــەنگی (بــەدر)دا پــێش دەســتکردن بــە جــەنگ کاتێــك موحەممەد سەیری کەمی لەشکرەکەی خۆی کردو سەیری زۆری لەشکری بتپەرستەکانی کرد زۆر دڵتەنگ بوو، بۆیـە دەسـتی کـرد بە نزاو پاڕانەوەی سەرکەوتن لـە خـوا، پـاش ماوەیـەك نـزا کـردن، قورئان فەرمووی: ( سَيُهۡزَمُ ٱلۡجَمۡعُ وَيُوَلُّونَ ٱلدُّبُرَ ﴿٤٥﴾ ) سورة القمر واتە ئەم کۆمەڵەی تۆ لێـی دەترسـیت ئەشـکێن و پشـتاو پشـت بـە شکاوی دەگەڕێنـەوەو ڕادەکـەن، پـێش دەسـتکردن بـە جـەنگ ئـەم هەواڵەیدا بە لەشکرەکەی، کەچی ئـەوەبوو بتپەرسـتەکان شـکان و موحەممەدو هاوەڵەکانی سەرکەوتن.

٣. موحەممەد و هاوەڵەکانی بە نیازی (حەج) کردن لـە مەدینـەوە دەرچـون بـۆ (مەککـە)، ئـەو کـات هێشـتا مەککـە لـە ژێـر چـەپۆکی بتپەرستەکاندا بـوو، بـەڵام قوڕەیشـییەکان نەیانهێشـت بـڕۆن بـۆ حــەج، لــە ئەنجامــدا کەوتنــە وتوویــژ، ئــەوەبوو (پــەیمانی حودەیبیــە)ی بــەناوبانگیان مــۆرکردو گەڕانــەوە بــۆ مەدینــە،

موسڵمانەکان گەلێك دڵتەنگ بون بەو نەچوونەیان بۆ مەککە، لێرەدا چاکترین مەڵهەمێك کە موسڵمانەکان ئەو برینەی پێ سارێژ بکەن ئەو پەیمانە بوو کە خوا بەخەوپیشانی موحەممەدی داو، قورئانیش ئەو پەیمانەی چەسپاند کە بەبێ شەڕو بەوپەڕی سەربەرزییەوە ئەڕۆن و مەککە لە ژەنگی بتپەرستی پاك ئەکەنەوە، وەك دەفەرموێ: (لَّقَدْ صَدَقَ ٱللَّهُ رَسُولَهُ ٱلرُّءْيَا بِٱلْحَقِّ ۖ لَتَدْخُلُنَّ ٱلْمَسْجِدَ ٱلْحَرَامَ إِن شَآءَ ٱللَّهُ ءَامِنِينَ مُحَلِّقِينَ رُءُوسَكُمْ وَمُقَصِّرِينَ لَا تَخَافُونَ ۖ فَعَلِمَ مَا لَمْ تَعْلَمُوا۟ فَجَعَلَ مِن دُونِ ذَٰلِكَ فَتْحًا قَرِيبًا ﴿٢٧﴾) ، سورة الفتح

واتە: ئەو خەوەی کە خوا پیشانی پێغەمبەرەکەی داوە ڕاستەو ئەڕۆنە مەککە (مسجد الحرام) بە مەیلی خوا و بەبێوەیی و دڵنیایی و لەوێ سەرتان ئەتاشن یان کورتی ئەکەنەوەو هیچ ترس نایەتە ڕێتان.

کەچی پاش دوو ساڵ بەبێ جەنگ و هەرا، بەبێ ترس و بیم بەسەربەرزییەوە بۆ دواجار مەککە کەوتە دەستی ئیسلام و مژدەکە هاتە دی.

بەدەیان نمونەی تر بەم شێوەیە کە قورئان هەواڵ و مژدەی داوە بە موحەممەد و هاوەڵەکانی و پاش ماوەیەکی کەم یان درەنگ هاتۆتە دی، وەك: (سَنَسِمُهُۥ عَلَى ٱلْخُرْطُومِ ﴿١٦﴾) سورة القلم

بۆ ئەنجامی ژیانی (وەلیدی کوڕی موغیرە) و ( وَإِذْ يَعِدُكُمُ ٱللَّهُ إِحْدَى ٱلطَّآئِفَتَيْنِ ) (الأنفال: ٧) بۆ ئەنجامی جەنگی بەدرو (وَٱللَّهُ يَعْصِمُكَ مِنَ ٱلنَّاسِ ) (المائدة: ٦٧)، بۆ لابردنی پاسەوان و...

( وَٱلْخَيْلَ وَٱلْبِغَالَ وَٱلْحَمِيرَ لِتَرْكَبُوهَا وَزِينَةً ۚ وَيَخْلُقُ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٨﴾ )

(سورة النحل ) بۆ داهاتنی فڕۆکەو ئۆتۆمبیل و... هتد.

## ئیعجازی قورئان :

ئیعجاز: لە مانای ئەم وشەیەدا مامۆستا شێخ موحەممەدی خاڵ لە تەفسیرەکەیدا دەفەرموێ: واتە دەستەوسانو داماوی بونی کەسێك لە کارێکدا وەك بەیەکێك بڵێیت (شاخی گۆیژە)م بە کۆڵ بۆ هەڵبگرە، دیارە کەس ناتوانێ هەڵیبگرێو هەموو کەس لە هەڵگرتنیدا دەستەوسانە.

قورئان لە هەموو ڕویەکەوە دەستەوسانییە، کەس ناتوانێ بە نیازی لاساییکردنەوەوە خۆی لە قەرەی بدات، بەکورتی ڕوەکانی ئیعجازی قورئان دەکرێت بە سێ بەشەوە:

١. ئیعجازی ڕەوانبێژی (بلاغی):

هەرکەسێك کەمێك شارەزایی لە ڕەوانبێژی زمانی عەرەبیدا هەبێت تامی ئەو ڕەوانبێژییەی قورئان دەکات، پایەی بەرزی قورئانو دەستەوسانی هەموو زاناکانی زمانەوانی لەم ڕووەوە بۆ دەردەکەوێت.

٢. ئیعجازی یاسادانانو فەرمان ڕەوایی (التشریع والحکم):

ئەو یاساو فەرمان ڕەواییەی لە قورئاندا هەیە باڵادەسترینی هەموو یاساکانە، ئەگەر هەزارانساڵی تری بەسەردا تێ بپەڕێ هەروەك لەو ڕۆژەدا دانرابێتو (تشریع) کرابێت وایە و بۆ هەموو گەلو نەتەوەو مرۆڤێك لە هەموو چەرخێکدا دەست دەدات،

ئەمــەش لــە توانــای هــیچ مرۆڤێکـدا نییــە بتوانــێ یاســایەکی هەتاهــەتایی دابنێــت، چــونکە دەبیــنین هــەر ماوەیــەك یاســایەك دادەنرێـــت و ماوەیـــەکی تـــر چاکســـازی تێـــدا دەکرێـــت و هەمواردەکرێتــەوە یــان بــە دانــانی یاســایەکی تــر جێگــای دەگیرێتــەوەو هیچیشــیان داخوازییــەکانی کۆمــەڵ نــادەن بــە دەستەوە.....هتد.

لەبەر کەمی ماوە ناتوانم لەمە زیاتر لەم دوو ڕووەی ئیعجاز بدوێم، بەڵام بەسەر پێیەکەوە هەندێکی کەم باسی ئیعجازی سێهەم دەکەم.

٣. ئیعجازی زانستی (علمی):

هیچ زانستێك نییە لەو زانستانەی کە ئەمڕۆی سەدەی بیست بــەرەو بیســـت و یــەك لــە زانکــۆو قوتابخانــەکانی جیهانــدا ئەخوێنرێن، قورئان پەنجەی بۆ ڕانەکێشابێ و باسی نەکردبێ، پتر لە (٧٥٠) ئایەتی تیایە کە باسی بونەوەرو گەردون ناسی و زانیاری دەرون و مێژوو... هتد دەکات

بۆ نموونە چەند ئایەتێکی زانستی دەخەینە پێش چاو هەتا بزانین ئایا ڕاستە کە مرۆڤێکی پێش هەزارو چوارسەد ساڵ لەمەوبەر دەتوانێت کتێبێکی وەك ئەم قورئانە بنوسێت، با یەکەم زانــای ســەدەی خۆیشــی بووبێــت، چ جــای موحەممــەدێکی

نەخوێندەوارو ژیاوی نیوە دورگەی عەرەبی و چەرخی نەفامێتی (عصر الجاهلية).
١. زۆرمان خوێندومانەتەوەو ئەزانین کە مندالْ لە سکی دایکیدا بەسێ پەردەی پڕوکڕ داپۆشراوەو بە هیچ جۆرێك نە ئاو نە تیشك و نە گەرما ناگات بەو کۆرپەیەو بەزمانی زانستی ئێستا بەو سێ پەردەیە ئەڵێن: (مەنباری، ئەمێونی، خوربۆنی)، بە زمانی عەرەبیش بە سێ پەردەی تاریك لە قەڵەم دەدرێت، ئایا موحەممەد لە کام زانکۆی پزیشکی زانستی کۆرپەلەناسی خوێندی تا ئەوەی بڵێ: ( يَخْلُقُكُمْ فِي بُطُونِ أُمَّهَٰتِكُمْ خَلْقًا مِّنۢ بَعْدِ خَلْقٍ فِي ظُلُمَٰتٍ ثَلَٰثٍ ) (الزمر: ٦)
واتە: ئەو خوایە دروستتان ئەکات لە سکی . منالْدان . ی دایکتاندا بە گۆڕینی شێوەی دروستکردن لە شێوەیەکەوە بۆ شێوەیەکی تر لە دواییدا لە سێ پەردەی تاریكو نووتەکدا.
٢. پێش هەڵدانی (ئۆپۆللۆی ١١) بەرەو مانگ پرسیارێك لە گۆڤاری (منبر الاسلام) لە (قاهیرە)دا کرا کە ئایا هەڵوێستی ئیسلام بەرامبەر بەم ڕۆشتنە بۆ سەر مانگ چییەو ئایا دەگەن یان ناگەن ؟
ئەویش لە ژمارەی مانگی نیسانی (١٩٦٩)دا وەڵامی پرسیارەکەی دایەوە . واتە پێش سێ مانگ چونە ناو مانگ ئەم

ڕونی کردەوە، چونکە گەشتەکە ڕۆژی ١٩٦٩/٧/١٦ دەستیپێکرد . وەڵامەکەی بە پێنووسی (د. موحەممەد شوقی فنجری) بوو، من بە کورتی و بە دەستکارییەوە هەندێکی ئەخەمە ڕوو بۆ بەڵگەی بەرزی و پایە بڵندی قورئانەکەمان و نەك گونجانی، بەڵکو باڵادەستیشی بەسەر چەرخی ئەتۆم و گەشتەکانی گەردوندا..

(... پرسیارتان کردبوو لە هەڵوێستی ئیسلام بەرامبەر بە گەشتەکانی ئاسمان، پێش هەزارو چوارسەد ساڵ قورئانەکەی ئێمە مژدەی داوە بە ئادەمیزاد کە هەر کاتێك توانی دەسەڵات پەیدا بکات دەتوانێ گەشتەکانی ئاسمان دەست پێ بکات نەك تەنیا بۆ سەر مانگ، بەڵکو بۆ دورتریش لە مانگ دەتوانێت بڕوات بە پێی دەقی ئایەتی: ( يَٰمَعۡشَرَ ٱلۡجِنِّ وَٱلۡإِنسِ إِنِ ٱسۡتَطَعۡتُمۡ أَن تَنفُذُواْ مِنۡ أَقۡطَارِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ فَٱنفُذُواْۚ لَا تَنفُذُونَ إِلَّا بِسُلۡطَٰنٖ ﴿٣٣﴾ ) ، الرحمن

واتە: ئەی کۆمەڵی پەری و ئادەمیزادان هەرکاتێك توانیتان بگەنە پلەیەك بڕۆن بەرەو هەرێمەکانی ئاسمان و زەوی ،.... بڕۆن، بەڵام ناتوانن بڕۆن بەهێز نەبێت .

زانستی ئێستا ئەو هێزەیەو لەوانەیە بتوانن بڕۆن، خۆئەگەر نەڕۆیشتن و نەگەیشتن ئەوە ڕادەی هێزەکەیان تەواو نییە.

واتاکەی قورئان بە کرداری فەرمان (فعل أمر)ە (فانفذوا) بڕۆن، ئەم (بڕۆن)ە مژدەی پشکنینی ئەستێرەکانە.

توخوا ئێوەو ویژدانتان هیچ کەسێك نەك بەر لە (١٤٠٠) ساڵ پێش ئێستا، بەڵکو بەر لە (٥٠) ساڵ پێش ئێستا دەیتوانی قسەی وا بکات، هەتا موحەممەدی نەخوێندەوارو ژیاوی سەدەی پێنجەمی زاینی بتوانێ بیکات ؟!!

٣. لە زانستی فەلسەفەدا، قورئان قوڵترین چاڵ هەڵئەکەنێ بۆ ئەو بەناو زانایانەی کە باوەڕیان بە بونی خوا نییەو دەفەرموێت:

( أَمْ خُلِقُوا مِنْ غَيْرِ شَيْءٍ أَمْ هُمُ الْخَالِقُونَ ﴿٣٥﴾ ) ، سورة الطور

واتە: ئایا ئەوان لە هیچ دروستکراون؟ یان خۆیان دروستکەری خۆیانن ؟؟!!

بەشێوەیەکی سادەو ئاسایی مێشکی ئەو هەموو فەیلەسوف و زانایانەی جیهانی شڵەقاندوە، هەر لە کۆنترین فەیلەسوفەوە هەتا ژیانیش بڕوات وەڵامی ئەم پرسیارەی قورئانیان پێ نادرێتەوە، تەنیا خۆبەدەستەوەدان نەبێت، کە بڵێن: نەخێر ئەی خوای بەهێزو بە توانا هەر تۆ خوای، هەر تۆ دروستت کردوین.

٤. هەموو شتێك لەم بونەوەرە پان و پۆڕەدا لە ئەتۆم (ذرة) پێکهاتووە، تەنانەت ئەو هەوایەی کە هەڵی ئەمژین، ئەو ئاوەی دەیخۆیتەوە، هەموو شت، ئەتۆم زۆر زۆر بچووکە، ئەگەر سەد

ملیۆن ئەتۆم لەسەر هێڵێکی ڕاست دابنێین درێژییەکەی ناگاتە (٢.٥)سم[٧].

هەتا سەدەی نۆزدەیەم زانایان وایان دەزانی کە (ذرة) بچوکترین شتەو لەت ناکرێت، ئەمە لە لایەکەوە، لە لایەکی ترەوە خۆ ئەوەتە قورئانەکەی موحەممەد بەرلە (١٤٠٠) ساڵ پێش ئێستا دەفەرموێت: ( وَمَا يَعۡزُبُ عَن رَّبِّكَ مِن مِّثۡقَالِ ذَرَّةٖ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَا فِي ٱلسَّمَآءِ وَلَآ أَصۡغَرَ مِن ذَٰلِكَ وَلَآ أَكۡبَرَ إِلَّا فِي كِتَٰبٖ مُّبِينٍ ﴿٦١﴾ ) ، سورة یونس

واتە: لە خوا ون نابێ نەهاوسەنگی هەرە وردی ئەتۆمێك و نە بچوکتر لەوەو نەلەویش گەورەتر.. ئەی ئەگەر ئەتۆم لەت نەکرێت چۆن قورئان ئەڵێ لەویش بچووکتر ؟؟!

بەڵێ بەو جۆرە مانای ئەم وشەیە وەکو نیشانەی پرسیار مابویەوە هەتا ساڵی (١٨٩٧)ی زاینی لەو ساڵەدا زانای ئینگلیزی (سێرتۆسۆن) توانی ئەتۆم لەت بکات و بۆی دەرکەوت کە لە سێ شت پێکهاتووە (پرۆتۆن، نیوترۆن، ئەلیکترۆن)، کەچی سەیر دەکەیت قورئانەکەی ئێمە پێش سێزدە سەدە پەنجەی بۆ ڕاکێشاوە.

ئەگەر بڵێین ئەم ئایەتانە زانایەکی زۆر بلیمەتی (١٤٠٠) ساڵ لەمەوبەر دایناوە، هیچ کەس بڕوامان پێ ناکات چ جای

٧ الذرات، د. انور عبدالواحد، ص٢.

نەخوێندەوارێکی وەك موحەممەد، کە بە هەتیوی و بە شوانی لە چۆڵایی ئەو دەشتە لماوییەی عەرەبستانو دوور لە هەموو شوێنەوارێکی شارستانێتی پێشکەوتوو دایبنابێت.

ئێمە لە پێش دەستەوسانێکداین کە هیچ کەس ناتوانێ بڵێ گەورەترین زانای جیهان دایناوە چ جای ئەو موحەممەدە، هیچ کەس ناتوانێ سەرپێچی لەو ڕاستییە بکات کە قورئان دانراوی کەسێکە باڵادەست ترە لە موحەممەد و هەموو عەرەبو ئادەمیزاد و بونەوەر.

قورئان دانراوی خوایە و نێرراوی خوایە بۆ هەمومان و بۆ هەموو مرۆڤێکی ژیرو خێرخواهێکی مرۆڤایەتی، ئەوەی کە چاوی ئەم ڕاستییە نەبینێ ئەوە کوێرە و نابینایەو ویژدانی بووە بە بەردو لە وتەی ڕاست کەڵك وەرناگرێت، جا با ئەو کەسانەی دوو چاوی زەقو دەمێکی پاراوی هەبێت، هەر بە کوێر ئەناسرێن، چونکە قورئانەکەی خوا دەفەرموێت: (فَإِنَّهَا لَا تَعْمَى ٱلْأَبْصَـٰرُ وَلَـٰكِن تَعْمَى ٱلْقُلُوبُ ٱلَّتِى فِى ٱلصُّدُورِ ﴿٤٦﴾ ) ، سورة الحج بەڕاستی کوێربونی چاوی سەر نرخی نییە، بەڵکو کوێربونی چاوی دڵو ونبونی هەستی دەرونی ستەمە.

## قورئان و ژیری ئەلیکترۆنی :

ماموستا شێخ موحەممەدی خاڵ لە سەرەتای تەفسیرەکەیدا دەفەرموێت: خوای مەزن دوو گێتی گەورەو پیرۆزی داناوە، یەکێکیان گۆیا (ناطق)و ئەویتریان بێ دەنگ، گۆیاکە (قورئانە)و بێ دەنگەکەیان (بونەوەر)ە.

کەواتە چۆن هەتا زانست پێش بکەوێ و ئامێری تازە بدۆزرێتەوە وردەکاری ئەم بونەوەرە و جێگای دەسەڵاتی خوا لەم بونەوەرەدا دەرئەکەوێت، ئاوەهاش هەتا زانست پێش بکەوێت پلەو پایەی قورئان زیاتر دەرئەکەوێت.

جاران کە قورئانمان دەخوێندو هەر تاوە نەتاوێك لەسەر سورەتەکاندا (بسم الله الرحمن الرحیم)مان ئەکرد، ئێمە لە کورتی ژیریی خۆمانەوە دەمانگوت ئەم هەموو (بسم الله..)یە چییە ؟ وامان دەزانی هەر بۆ جوانی یان بەبێ سوود دانراون، کەچی وا لە کۆتایی سەدەی بیستەمدا ژیری ئەلیکترۆنی بۆمان دەردەخات کە هەموو پیتێك‌و هەموو وشەیەك‌و هەموو ڕستەیەك لە قورئاندا بە پێی تەرازوی خوایەتی کێشراوەو لە جێگای ڕاست‌و دروستی خۆیدا دانراوە، قورئان خۆی دەفەرموێت:

( ٱللَّهُ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ ٱلْكِتَٰبَ بِٱلْحَقِّ وَٱلْمِيزَانَ ) ، ( الشوری: ١٧)

بەڵام کام تەرازوو؟ تەرازویەك بە موو هەڵە ناکات.

هـەروەها بـۆ پیتـە پچرپچـڕەكانی سـەرەتای هەنـدێ سـورەت وەك: (الم، حـم، ص، ن، كهـيعص،... هتـد)، نـەك زاناكـانی ئێمـە، بەڵكو هـەموو زاناكـانی هـەموو چـەرخەكانی ئیسـلام هیچیان لـەم بارەیــەوە نــەزانیوە هــەتا ژیریــی ئــەلیكترۆنی ســەرەتایەكی لــەم بارەوە بۆ دەرخستین.

جـا لەبـەر ئـەوەی باسـەكە پێویسـتی بـە كـاتێكی زۆر هەیـەو لێرەشـدا ئـەو كاتـەمان نییـە، تـەنها وەك بـەركولێك لـەو لـەزەتی باوەڕە خواردنە گیانییە كەمێك باس ئەكەین.

لاوێكی میسری بەناوی (رشاد خلیفه) كە بڕوانامەی دكتۆرای هەیە لە كیمیادا كاتێكی زۆرو داراییەكی زۆری لە ڕۆژانەی خۆی گرتۆتەوە بۆ ئەم مەبەستە پیرۆزە.

## دكتۆر ڕەشاد دەڵێت:

(بسم الله الرحمن الرحيم) پەیوەندییەكی بەتینی هەیە لەگەڵ هــەموو ســورەتەكانی قورئــانی پــیرۆزدا كــە بــریتین لــە (١١٤) ســورەت، بــەڵكو (بســم الله) تەرازوویەكــە بــۆ كێشــانی قورئــانو پەرژینێكــە بــۆ هــەموو دەســتێكی چــەپەڵ كــە ویســتبێتی یــان بیەوێت دەستكاری قورئان بكاتو (بسم الله) بۆمان دەردەخات كە تا ئێستا یەك پیت لە قورئاندا نە زیادو نە كەم نەكراوە،

(بسـم الله الـرحمن الـرحيم) پێكهـاتووە لـە (١٩) پیـت، كـە ئـەم ژمارەیە خۆبەخشە واتە بەسەر خۆیو یەكدا نەبێت ئیتر بەش ناكرێت بەسەر هیچ ژمارەیەكی تردا، كە ئەمەیش بە پێچەوانەی (١٨)و (٢٠)وەیــە كــە دابەشــن و هەریەكــەیان بەســەر چــەند ژمارەیەكدا دابەش دەكرێن، هەروەها لە قورئاندا (١١٤)

(بسم الله) هەیە، چونكە لـە سورەتی (توبـە)دا نییـە، بـەڵام لـە سورەتی (نمل)دا دوو (بسم الله..) هەیە.

وشەی (اسم) لە قورئاندا (١٩) جار هاتووە، واتە بە ئەندازەی پیتەكانی (بسم الله الرحمن الـرحيم) و وشـەی (بسـم) لـە قورئانـدا (٣) جار هاتووە، ئەگەر (اسم) بدەین لە (بسم)

واتـە (١٩× ٣ = ٥٧)، ئەمـەیش یەكسـانە بـە ژمـارەی وشـەی (الرحمن) لە قورئاندا.

هـەروەها (الـرحيم) سـەرەڕای ئـەو (الرحيم)انـەی لـە (بسـم الله..)كاندا هاتووە، (١١٤) جاری تر وشەی (الـرحيم) لـە قورئانـدا هاتووە، واتە بە ئەندازەی سورەتەكانی قورئان.

وشەی (الله) لە قورئاندا (٢٦٩٨) جار هـاتووە، كـە بريتييـە لـە (١٩×١٤٢)، ئـەم ژمـارەی (١٩)يـە بـووە بـە تـەرازويـەك كـە هـەرچـی پيتی سورەتەكانی قورئان هەيە ئەبێ بەش بكرێت بەسەريدا، بەم شێوەيە بە هـيچ جۆرێك يـەك تاقـە پيـت لـە قورئانـدا دەسـتكاری نـەكراوە، چـونكە ئەگـەر دەسـتكاری بكرايـە يـان بگۆڕڕايـە بـە پيتێكـی تـر، يـان وشـەيەكی تـر، بـەو شـێوەيە ئـەو وشـەو پيتانـە دابەش نەدەكران بەسەر (١٩)دا.

نموونـە بـۆ پيـت: ئەگـەر (صـلوة، زكـوة، حيـواة) بـە ئـيملای عـەرەبی سـادە واتـە بـە (صـلاة، زكـاة، حيـاة) بنوسـرايە ئـەوا ژمـارەی (ألـف) زيـادی ئـەكردو ژمـارەی (و) كـەمی ئـەكردو ئـەو سـورەتە لەگـەڵ تـرازوی قورئانـدا دەرنەئەچـوو، بەسـەر (١٩)شـدا دابەش نەدەكرا.

نموونە بۆ وشە: لە قورئاندا دوو سورەت هەيە كە پيتی (ق)ی تـاكی تێـدا بێـت ئـەوانيش سـورەتی (شـوری = حـم عسـق)و سورەتی (ق والقرآن المجيد)ن، سورەتی (شـوری) دوو ئەوەنـدەی سـورەتی (ق)ە، كەچـی پيتـی (ق) لـە سـورەتی (شـوری)دا (٥٧) جار هاتووەو لە سورەتی (ق)يشـدا هـەر (٥٧) جار هـاتووە، واتـە

بــە ئەنــدازەی یــەکتر، دیســان (٥٧+ ٥٧= ١١٤) ژمــارەی پیتــی قافەکانی هەردوو سورەتەکە بە ئەندازەی سورەتەکانی قورئانن، دیسـان بـۆ جـارێکی تـر بزانـە سـورەتی (ق) چـۆن دەسـت پـێ ئـەکاتو چـۆن کۆتـایی دێـت؟ سـەرەتا ئەفـەرموێ (ق والقـرآن المجید) و دوا ئایەتی دەفەرموێت:

( فَذَكِّرْ بِٱلْقُرْءَانِ مَن يَخَافُ وَعِيدِ ﴿٤٥﴾ ) ، سورة ق

هەروەها بۆ کێشانی (ق)ەکان لەگەڵ (بسم الله...)دا ، (١٩× ٦= ١١٤)، دەبێ ئەوەش بزانین هەروەك چۆن تاقە پیتێك لە قورئانـدا نـەگۆڕاوە، ئاوەهـاش تاقـە وشـەیەکیش لـە قورئانـدا نەگوێزراوەتەوە و نەگۆڕاوە، بۆ نموونە: لە (١٢) شوێندا خوا لە قورئانـدا باسـی نەتـەوەی (لـوط پێغەمبـەر) دەکـات و لـە هـەموو شوێنەکاندا دەفەرموێت (قوم لـوط) کەچی بە تـەنیا لـە سورەتی (ق)دا دەفەرموێت: (إخوان لوط)، ژیریی ئەلیکترۆنی دەڵێت:

ئەگەر لێرەشدا وەك (١١) جارەکەی تر بیفەرمویایە (قوم لـوط) ژمـارەی (ق) لـەم سـورەتەدا ئـەبوو بـە (٥٨) قـاف هـەم ژمـارەی (ق)ەکان زیاتر ئـەبوو لـە سورەتی (شوری) هـەم دابـەش نـەدەبوو بەسەر (١٩)دا، لێرەدا داوای لێبوردنتان لێ دەکەم کە ناتوانم ئەو دەستەوسانەی کە ژیریی ئـەلیکترۆنی لـە سورەتەکانی (الم، حم، ص، کهـیعص، طسـم..) دەری هێنـاوە بـاس بکـەم، لـە خـوا

ئەپارێمـەوە کـە یارمـەتیم بـدات تـا لـە نامیلکەیەکـدا کۆیـان بکەمـەوەو بیخەمـە بەردەسـت خوێندەوارانـەوە، هـەتا بتـوانن دەستەوسـانی هـەموو مرۆڤێـك و لـە هـەموو سـەدەکانی ژیـانی مرۆڤایەتیدا بەرامبەر بە قورئان دەربخەین.

کـێ هەیـە لـە جیهانـدا بڵـێ، موحەممـەد وتـی: قورئانێـك دەنوسـمو بـەرزترین ژمـارەی پیتـەکانی (ق) لـە قورئانـدا ئەخەمـە سورەتی (ق)، یان بڵێ سورەتێك دەنوسمو ناوی دەنێم (البقـرة)و بـە (الم) دەسـتی پـێ دەکـەمو دەبـێ ژمـارەی ئـەو (أ)انـەی کـە تیایەتی (٢٥٧٨) (أ) بێتو ژمارەی (ل) (١٨٨٥)و ژمارەی (م)کان (١٢٥١) بێت، ئایا قورئانێك لە ماوەی (٢٣) ساڵدا بێتـە خوارەوە چـۆن دەتوانێـت ئـەو (ألف)انـە کۆبکاتـەوەو بزانێـت کـە ژمـارەی (الف) لە (ل) و (ل) لە (م) زیاتر دەبێت؟ ئەگەر ژێـری ئـەلیکترۆنی سـەدەی بیسـت نـەبێ کـێ بـە بیریـدا دێـت ئـەو پیتانـە بـژمێرێت؟ فەرموو با قوتابییەکانی ساتێرو ڤۆلتێر وەڵاممان بدەنەوە.

**ئەنجام :**

**قورئـان دەريايـەكی بـیٛ بنـەو بونـەوەرێكی پـان و پـۆڕە، نـە بـەم سـەرپێييەو نـە بـە هـەزاران كتـێبی تـرو نـە بـە گـەورەترين ژێريـی ئـەليكترۆنی ئـەم دەريـاو ئـەم بونـەوەرە گەشـت ناكرێـت و كۆتـايی نايـەت، بـەڵام ئـەوەی كـە مـن مەبەسـتم بێـت ئەوەيـە وەك كـورد دەڵێت: (ئەو كەسە كەسە، حەرفێكی بەسە)، خۆئەگەر ناكەسيش بێت نە بە من و نە بە هيچ مرۆڤێك ناكرێت بە كەس.**

**زۆرم لیٛ ڕونـە ئەگەر بە دڵ گـویٛ گيرابێت بۆ ئـەم لێكۆڵينـەوە سەرپێييە هەركەسە بیٛ لايـەنگيری كـردن سـەيری باسـەكە بكـات، پڕبـەپڕی دڵـی و مێشـكی بـاوەڕ دەهێنێـت كـە قورئـان نێـرراوی خوايـە، ئـەو خوايـەی كـە خـاوەنی ئێمـە و موحەممـەد و هـەموو بونەوەرە، ئەوەش كە بڕوا ناكات قورئان پێی دەڵێت:**

﴿ قُلۡ فَأۡتُواْ بِسُورَةٖ مِّثۡلِهِۦ وَٱدۡعُواْ مَنِ ٱسۡتَطَعۡتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ ﴾ **(يـونس: ٣٨)**

**خـۆ ئەگـەر ناشـتوانن بـە وێنـەی ئـەم قورئانـە تاقـە سـورەتێك بنوسـن و بڵـێن، دەبـابزانن كـە ئـەنجامی لاسـاريی و سەرپێچـييان ئەوەيە كە لە قورئاندا خوا دەفەرموێت:**

﴿ فَإِن لَّمۡ تَفۡعَلُواْ وَلَن تَفۡعَلُواْ فَٱتَّقُواْ ٱلنَّارَ ٱلَّتِي وَقُودُهَا ٱلنَّاسُ وَٱلۡحِجَارَةُۖ أُعِدَّتۡ لِلۡكَٰفِرِينَ ٢٤ ﴾ **(البقرة: ٢٤).**

**سەيدصادق**

**١٩٧٦/٧/١٣**

## سوپاس :

* زۆر سوپاسی برای خۆشەویست کاك ( بەختیار ئیبراهیم هەرمنی ) دەکەم کە ئەرکی لە چاپدانی ئەم نامیلکەیەی خستە ئەستۆی خۆی.

* زۆر سوپاس بۆ وێنەکێش کاك (عەبدولقادر میرخان) و خۆشنوس کاك (موحسین حسەین پیرۆت)و کاك (هیوا عومەر ئەحمەد) کە بەرگی نامیلکەکەو سەردێڕەکەیان بۆ ڕازاندمەوە.

* زۆر سوپاسی کرێکارانی چاپخانە دەکەم بەتایبەتی پیت ڕێکخەر کاك (عوسمان مەحمود کەریم).

م. شارەزووری

**ئەم كتێبە :**

**هەڵســەنگاندنی قورئانــە بــە تــەرازووی زانیارییــەكانی تــازەو ژێریی ئەلیكترۆنی و دۆزینەوەی دانەرەكەی.**

## ناوەرۆك

# زنجیرەی پەیامەکانی ڕێنوێن




نرخی ١٥٠٠دینارە